# دیوانی
# نامۆیەکی سەرفراز

نوسینی:
ئەرسەلان شەوکەت عبدالرحمان
ناسراو بەعەلی هەولێری فێرگە

1438 کۆچی
2016 زاینی

ناوی کتێب : "دیوانی نامۆیەکی سەرفراز"

نوسەر: "ئەرسەلان شەوکەت عبدالرحمن
ناوسراو:علی هەولێری فێرگە"

نەخشەسازی ناوەوە: گەنجێکی تەوحیدی"

# پێشەكی

## بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله وحده، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده:**

ئاشـكرايه شـيعر،ئاوێنەی ڕاگەياندنی هەڵسـووكەوتی دەورە جۆراو جۆرەكانە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموويەتی: (إن من الشعر حكمه) واتە' لەشـيعردا حيكمەت هەيە .ئەو شـيعرانەی حيكمەتيان تێدايە تابلۆيەك ئەسـازێنن كە كوڕی شـين ئەكا بە شـادی،زۆر چاريش وەكو فيشـەك و تيرێك دڵی ناحەزان ئەپێكێ مەگەر شيعرەكانی هاوەڵی "ئازيز حسـان كوڕی ثابت" 'ڕەزای خودای لێبێت' پێش هاويشـتنی تيرو ڕمی هـاوەڵان،كـافرەكـانی نەئەپێكـا! مەگە رزۆرشـيعر دڵی مرۆڤ گەلی خۆبەخوازانی نەهێنايە لەرزين، ئەوە شـيعرانەی كە پڕن لەحيكمەت لەوەيە بە چەند ووتارو موحازەرە ئەوەندە سوودوكاريگەری نەبێت بۆ گوێگرەكەی، ئەو بەيتە شــيعرانەش كـە زۆر جوانن وپڕن لەمـانـای جوان كە بەدڵنيايی تەنها هەڵقوڵاوی قورئانوسـوننەتن وبيرخسـتنەوە و پەندو ئامۆژگاری و عيبرەتی تێدا بۆ موسـڵمانان. ئەو شـيعرانەی پڕن لەحيكمەت وەك هەنگوين بەتام و شــيفا بەخشــی دڵی دنيان، هەر بۆيەناديدە گرتنی هەوڵو كۆششی هەنگو شاعير بێ مروەتيە، لەوانەيە وەك ئاو بێتام دێتە بەرچاو، بەڵام پێويســتی ژيانەو سـێبەرە بۆ ئارامی ڕۆح و فێنكی دەرون،

لە صـەحيحی مسـلم دا هاتووە هاوەڵی ئازيز (شـريد) 'ڕەزای خودای لێبێـت' دەگێڕێتـەوە ئـەفـەرمووێ: ڕۆژێـك لـە دوای پێغـەمبـەری خودا (ﷺ) ســواری وڵاخێـك بوبوم، ئـەڵێ پێغـەمبـەری ئـازيزمـان (ﷺ)

فەرمووی: (ئایا شتێکت لاهەیە لە شیعری (امیە)ی کوڕی (أبي الصلت)؟ ئەڵێ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (بیلێ)، شیعرێکم بۆ وت، فەرمووی: (هی تریش) شیعرێ تریشم بۆ ووت، فەرمووی: (هی تریش) هەتا گەیشتە سەد شیعر. بەراستی ئەوشیعرانەی کەپڕن لەحیکمەت دەرگا بەسەر جەهالەتا دائەخەن و پەنجەرە بەڕووی ڕووناکی و ئەفراندنا ئەکەنەوە، ئەگونجێ وەك غەریبێك هاودەمی هەژاران و چەواساوان بێت و دەوڵەمەند بێت بەمەعریفە!بەکورتی ئەشێ شیری خواردنەوە بێت و هەم (چەك)ی مەیدانی جەنگ وجیهاد بێت، بەڵام چۆنایەتی ئەو شەڕە گرنگە بۆ ئەوەی شیعرهێزو شکۆی خۆی لەدەست نەدا.

سوپاس بۆ خودای پەروەردگار کە تەمەنی پێ بەخشیم و دەرفەتی پێدام لەم سەردەمی غوربەتە کەبەخوێن ئەگرین، لەچەندین کات وساتی پڕ ناسۆروئازارو شەونخونی خامێکی ڕاستگۆ بەدەست بگرم وئەم نامیلکە بنووسم. پەیامی ڕاگرتنی باڵانسی وەفاداری وئامێز بۆ فرقان ئاوەڵا کەم و تەمی سەر ڕوخساری حەق و ڕاستی برەوێنمەوە. بێ ئەوەی هیچ تەعەصوب و خۆفرۆشی وتەمەلوق و مەدح و ترس ودڵە ڕاوکێی تێدابێت .

براتان: عەلی هەولێری فێرگە
14 سەفەری 1438 کۆچی
بەرامبەر بە 2016/11/13 زاینی ، تورکیا

# ئەی ئالآی تەوحید

**********************

دووژمنانت بەدەست زوبان بەگشت ڕەنگێ

سەرشۆڕو ڕیسوان لەهەرکوێ بن وکەنــگێ

تۆڕووناکی شەوی....ئاســۆی خۆری رزگاری

ڕابردووت لەنێودڵە.هەمیشە تاسەی بێداری

کەهاتی نەت هێشت بێدینی شیرك وبەندی

لەسەرەتا کوفرتۆقێن بووی هەروا بەمەردی

باڵاو سێبەرو پەسیووت پەنا گە بووبۆ نەداران

خۆشی هەڵدەرێژابەسەرچەوساوان وهەژاران

موجاهیدان بەمەچەکی خوێناوی بۆ بەرزی تۆ

یەك یەك ئەبوونە قوربانی لەخزمەت پاکی تۆ

پەیمان بێت ئێمەش لەسیمای پاکت ڕامینین

ئازیزی دڵان.... تاکوو ناحەزان بەچۆك دادێنین

ئەی ئالآی تەوحید بەرزوو پیرۆز.جوان و پاکی

بەتۆ جوانە وولات،بێ تۆ وێرانە.بێ ڕووناکی

---

25 دولحیجحە 1436 کۆچی بەرامبەر 2015/10/9 زاینی

# مەنهەجم ورێبازم

**********************

ڕێگاو ڕێبازم

مەنهەجی پاکی پێشینە

مەبەستمان...!

سەرخستنی تەوحیدو

حەق ڕاستی دینە..

دوور لەهەمووخورافاتێ

دوور لە بیدعە

دوور لە گومڕاو موبتەدیع

دوور لەهەموو دین فرۆشێ

خودا. نیەتمان پێ ببەخشێ

هەردوو بەهرە..!

تەقواو وەرع..

نیەت پاکی و (الإخلاص) مان بێ

قورئان ،فەرموودە..

بەتێگەیشتنی سەلەف

ناتێگەیشتنی کوێرانەی

جەهل و عەقڵانی خەلەف

خوشکی سەنگینم!!

برای بەڕێزم !!

زۆر زۆر ووریابە.

زۆر چاک بیزانە .

تاکە ڕێگابێ کە سەلامەتە.

شیفای دڵانە

ڕێگای سەلەفە

ئاسوودەی وئارامیە

چارەسەری گشت دەردانە

عەقیدەی پاك.

دامەزراو ..

زۆر مەحکەم و زۆر چاك

بیروباوەڕی پێشینە

باشترین بارودۆخی ئیمان

ئەوان بوویانە

لەدووای ئەوان

کوێرەوەوری و ڕۆچوونە

خەفەت مەخۆ

كەوا نامۆی

خەفەت مەخۆ!!

لۆمەت ئەكەن

لێرەو لەوێ

موژدەی پێغەمبەری ئازیزمانە..

كە ئەفەرمووێ .

سەرفرازی بۆ نامۆیانە

وەرن بابەیەك دەنگ

بەیەكەوە هەموو بڵێین

بە(تەوحید) بڕوادارین

دژی كوفرو شیرك

دژی ستەم

بەدەست زووبان

لەمەیدانین

بەدەست زووبان

لەمەیدانین

پێناسەی سەلەف: واتە پێشین،سەلەفی بەو کەسە دەگوترێت شوێن کەوتەی پەیڕەوی سەلەف بێت، ئەوەش بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان و سوننەت بەتێگەشتنی سەلەف (هاوەڵە ئازیزەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و ئەوانەی دوای ئەوان و ئەوانەی دوای ئەوانیش) سەلەفیەت ئەو ڕێبازەیە لە دینداریتیدا کە سەلەفی صاڵحی لە سەر بووە،پێشینی چاکەکانی ئەم ئومەتە؛ واتە؛ پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاوەڵانی'ڕەزای خودایان لیبێت' لە سەر بووە، لە بواری بیروباوەڕ و بانگەوازی، وە لە بوارەکانی فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خەراپە، وە لە بوارەکانی ڕەوشت و پەروەردە و مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵك وتێکڕای بوارەکان لە دیندا

مەنهەجی سەلەفیش شوێن کەوتنی کیتاب و سوننەتە. گرنگی دان وبانگەوزیان بۆ تەحیدە .سەلەفییەت نیسبەتە بۆ لای سەلەف وەسەلەفیش هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودان(ﷺ) وەپێشەوایانی ڕێگای هیدایەتن لەسێ سەدەی یەکەم ڕەزای خودایان لەسەر بێت ئەوانەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) شایەتی چاك وخەیری بۆ داون کە فەرموویەتی؛ (چاکترینی خەڵك سەدەی منن پاشان ئەوانەی لە دوایان دێن پاشان ئەوانەی لەدوایان دێن پاشان قەومی وادێن کە شایەتیان پێش سوێندیان ئەکەوێ وەسوێندیان پێش شایەتییان، خودای گەورە لەسەر ئەم ڕێگا سەلامەتە دامەزراومان بکات و بەردەوامیمان پێ ببەخشێت.

----------------

10 ڕەبیعی یەکەمی 1438 کۆچی

بەرامبەر بە 2016/12/10

# دیمكراسیەت یان دیموكراتیەت

***********************

هێمایی بێدینین؟ دیمكراسیەت و دیمكراتیەت!
شێربەنجەی سەردەم بەرماوەی كوفرو جەهالەت،
ئەم ڤایرۆسەی كەلەعەقلی زۆر خەڵكی داوە
گۆڕانی هێناوە بەسەر دین و ژین و دونیاوە
لە هەر شوێنێكا كاری پێ بكرێ
حەق،ڕاستی ئەمن و ئەمان نامێنێ
هەموو میللەت بەجارێ گیرۆدە ئەبن
ڕەحم وبەزەیی و ئەخلاق دەردێنێ لەبن
كام دیموكراسیەت ئەوەی لەمیسر بەموسڵمانیان كرد!
منداڵ و پیرو ئافرەت و گەنجیان خەڵتانی خوێن كرد
جگە هەندێكی پێشی ڕازیبوون. بانگهێشتیان بۆكرد ؟
كەپشتیان هەڵكرد هێزوو عسكەریان بەسەریانا كرد
ڕاستی زۆر ئەسەف بۆ هەندێ موسڵمانانی سەردەم!
كەبانگەشەیان بۆ دیمكراسیەتە لە ئیسلام بێ خەم
ئێمە بەئیسلام عەزیز بووین.. نەوەك دیموكراسیەت
نە بەڕازی كردنی كوفر،نە هەوڵی كورسی و زەعامەت

تو خواکەی ئەمەکاری موسڵمانە بۆدەسەڵات دین بدۆڕێنێ ؟
ئاوادەرگابۆکوفر واڵاکا و خۆی لەزوڵم و فەساد نەگەیەنێ
چاك دڵنیابن هەرکەسێ جگە لەئیسلامی قبوڵ بێ
زەرەرمەندەو خاوەنی شەڕەف و خاك ووڵاتی نابێ
سوێند بەخودا ئەگەر موسڵمان ئاوازەن ببا؟
ئاواسەری خۆیی و حەوت پشتی بەقوڕا ئەبا..

--------------------------------

(حسبنااللە ونعم الوکیل)

1434 کۆچی بەرامبەر 2013/8/25زاینی

## سۆزێك بۆ
## خوشك برا مەزڵومەكانمان لەمیسر

************************

ئەی خودای پەروەردگار خاوەنی زەویی وئاسمانەكان
بسێنە تۆڵەی ئەم خەڵكە مەزڵوومە لەستەم كاران
خودای كاربەچێ تۆهیچت لێ وون نابێ
لەكردەوەیی هیچ زاڵم و ستەم كارێ
خوشك و برایانمان لەمیسری دایكی دونیادا
سەر خەبەسەر كودەتا چیە دڕەندەكاندا
ئەی براوخوشكانمان ئەی ستەم لێكراوەكان
دڵنیابن بەژدارین لە ئازارو میحنەتتان
دڵنیابن وەك رۆژی رووناك لێمان ڕوونە
داهاتو بۆئیسلامەو بەشی كوفرلەناوچوونە
ئارامبگرن هەر گرمەی تەكبیرێكتان
دێنێتە هەژان بنكەو قەڵای بێدینەكان
ئارام بگرن فرمێسك وخوێنە ڕژاوەكان
لافاوەڕائەماڵێ بەچكە پیسە فرعەوەنەكان

---

1434 كۆچی بەرامبەر بە 2013/8/18زاینی

# هۆنراوەی غوربەت

************************

هۆنراوەی غوربەت پێناسە ی ئەم زەمانە پڕغوربەتییەی ئەهلی ئیسلامە کە بێ پەناو پەسیوو وپەرژینن موسڵمانان بێ هێزوو لاواز.. لەسەر ئەم حاڵەش داخی گرانم گەرچی موسڵمانان هەر خەریکی یەکدین و بچڕ پچڕ هەرەیەکە ناوێکی لەخۆیناوە خەمی ئەم ئیسلامەو خەڵکیان لەبەرنەماوەخواناسان ئەکوژرێن دەرئەکرێن و زیندانی ئەکرێن دەم بەست ئەکرێن مافیان ئەخورێ کەس دەنگی لێوە نایەت وەك بڵێی دونیا شامی شەریف بێت. سوێند بەخودا ئەگەر بەخۆمان دانەچینەوەو یەک نەگرین و کۆمەک بەیەک نەکەین ئیسلاحی حاڵی خۆمان نەکەینەوە حاڵمان زۆر لەوە خراپتر ئەبێت !

ئای لەم زەمەنە!

ئای لە م غوربەتە!

کوشتنی خواناسان

لای بێباوەڕان

وەك ئاو خواردنەوە

ئاسان عاداتە!!

ملیارونیوێک !

ئێمەی موسڵمان

بۆچی کەس ناڵێ

ئەی کوا عیزەتمان؟

خۆ بیستی خۆراگر

لەنێو خۆماندا

بەقەد دووسەدە..

لەزاڵماندا

بەڵام داخ !!

حەیف و داخ !

کە موسڵمانان

لەیەک ترازاو

بچڕ بچڕن

وازهێنانیان لەکوفر

چارێ خەریکی یەکترن!

هەرکەس لەئاست خۆی

هەر خۆی پێ چاکە

بۆلەسەریەك نووسین

لەبلەبانە. گورچە چالاکە؟

لەئاست دوژمنان

ملکەچ و ڕازی

لەحەقیش لاڵە!

هەرایە بەرگری بۆ بودجە

بۆ کورسیە شڕەکەی نێو پەرلەمانە

موسڵمانانیش بێ پەرژین

توخودا کەی ئەمە حاڵە؟!

کەی ئیسلام ڕێی داوە

بەم حاڵ و باڵە؟!

وازانایان یەک یەک

بێدەنگ ئەکرێن

تیرۆر ئەکرێن..

خوێنیان حەڵاڵە

زانایانێك!

کە لای خوداچاك گوفتارن

میرات گری پێغەمبەرن

سادەو ئاسان!

لەووڵاتی موسڵمانان

ئەکوژرێن و دەربەدەرن!

وەک برینی کاکۆڵ خوێناوی!

مامۆستا (ڕەمەزانی )موەحید

دەروونی سوننەت و قورئان

وەک برینی کاکۆڵ خوێناوی!

مامۆستا (عبداللە ی قەصریێ)

کەلەسینەی هەڵگرتبوو
هەموو قورئان.
وەک (شەریف)ی کاکۆڵ خوێناوی !
دەنگی قورئان و شەونوێژ و گریان
ئەی موسڵمانان!
لەخودا بترسن
پێش بەڵا پێش بێت
زیاتر زەلیل بن ..
خاکمان بەسەر!
فەرمایشتی خودایە
ئەگەر کۆمەک نەکەین
دژی یەك بین
یەکتر نەگرین، لەڕێدایە
تاوان ، گوناە
ئازار، ناخۆشی
بۆ ئیمانداران سەختە سزایە
بەسە موسڵمان!
ئەوە بکە کەخودا ئەیەوێ!!

ئەم نەفسە بەئەو بفرۆشە

تاكو قيامەتت دەس كەوێ ..

بەسە تەمەن زۆركەمە

مردن هەر پێش دێ..

سەربەرزی بۆئەو كەسە !!

بۆئەم دینە گیان بەخت ئەكا...

دڵۆپ دڵۆپ بەخوێنی؟

ئاسۆی ئەم ئیسلامە گەش ئەكا...

دڵۆپ دڵۆپ بەخوێنی؟

ئاسۆی ئەم ئیسلامە گەش ئەكا..

---

1434كۆچی بەرامبەر بە 2013/2/10زاینی

# خوشکی باڵاپۆش

************************

ئەم هۆنراوەیە پێشکەشە تەنها بەو خوشکە سەنگین و سروشتپاکانەی کەشوێنکەوتەی قورئان و سوننەتن و هەمیشە زۆر بەچاکی خۆیان دادەپۆشن و پۆشاکی شەرم و حەیایان لەبەردایە و لە هیچ توانج و لۆمەی لۆمەکارێك ناترسن و ئازا و جەریئن. خودای پەروەردگار هاوشێوەیان زیاتربکات لە کۆمەڵگاکەماندا داوا دەکەم لە خودای پەروەردگار بیانپارێزێت و سەربەرزی دنیا و قیامەتیان بکات!

خوشکی سەنگینم، خوشکی باڵاپۆش
وەلانەری لۆمە و قسەی دڵنەخۆش
ئەی دڵپڕباوەڕ، قەڵای پڕحەشمەت
ئەی بەئیستیقامە لەسەر عیبادەت
باڵاپۆشیت، ڕەوشتپاکی وسەنگەری حەقە
بۆ ناحەزو بەدڕەوشتان، وەڵامی قورس و ڕەقە
ئەم پاکییەی تۆ بوو فەسادی هەڵتەکاند
تەختی شەیتان و بێئابڕووانی ڕووخاند

ئەم نیقاب و عەبایەی تۆ پاك ڕاگری كۆمەڵگایە
ناسنامەی سەرفرازی و پۆشاكی شەرم و حەیایە
ئەم نیقاب و عەبایەی تۆ دائەپۆشێت
دڕكە بۆ چاوی ناحەز، تا نەزەر نەكا لێت
هەر سەرفراز بی خوشكی بەهێزم
پاك و نوورانی مەرد و بەڕێزم
خۆزگە ئەوانەی سفوور بێئاگا سەریان كۆت ئەكەن
بیر لە گۆڕ بكەن، حیجاب بپۆشن، چاو لە تۆ بكەن
دەپاڕێمەوە لە خودای پەروەردگار
بەردەوامت بكات، هەروا تەوبەكار
پارێزراوت كات، لە شەڕی بەدكار
هەروا نوسیبەیەك بیت پۆڵا و بڕوادار
هەروا نوسیبەیەك بیت پۆڵا و بڕوادار

---

١٤٣٤ی كۆچی، بەرامبەر ٢٠١٢/١٢/٢٦ی زایینی

ئەم هۆنراوەیە بەناوی خازۆ ڕەنجەڕۆی سەرلێشێواو، وەڵامێکە بۆ بۆ مەریوان هەڵەبجەی و هاوشێوانی کەوتبووی من پێشبنی زیاتری زیندانم ئە کرد بۆ مەلا کرێکار، بەڵام پێشبینیەکەم هەڵە بوو، هەروەها ئەڵێ بەهەر بارێکدا بێت من وەک مەریوان هەڵەبجەیی لەو دادگایەدا سەرکەوتنم بەدەست هێنا؟ ئێمەش ئەلێین بەزیمان بەعەقلی تۆوهاوشێوەی تۆ دادێتەوە کە ئەبینین تف سەرەو هەوراز هەڵ ئەدەن و بە دەمووچاوی ناپوختی خۆتان ئەکەوێتەوە ، باشە بێ نرخ و رقن دژایەتی ئیسلام و درۆو بوختان شۆفاری و جاسوسی و بە سەرکەوتن ئەزانی یان بە لاپەرەیەك و پەڵێکی ڕەش لەمێژووی پڕ ریسواییت ئەمە سەرکەوتنە یان ڕۆچوون وسەرکزی بەڕاستی نەفامی کە بەنەسەقی داروومانت هەڵ ئەپەڕی و نازانی لەڕاستیدا کەدۆراوێکی بێ وێنەی ...

ئەمەش هۆنراوەکە:

# خازۆ ڕەنجەڕۆی سەرلێشێواو

***********************

گومڕای سەر شێواو داماوی دۆڕاو
هەرئاخ هەڵکێشە بەداخ وزوخاو
زۆر وەك تۆ ناپاك دژی حەق وەستان
بوونەدڕك و كۆسپ لەڕێ خوا ویستان
بوون بەنۆكەری دوژمنانی ئیسلام
بەكردەوەو هێز بەنوسین و خام
بێشەرم نەشەرم لەخودا نەلەخەڵكی
بێ كەڵك نەفام لەحەق و ڕاستی
ئەوەندەی ڕقن و بۆگەن لەسەر تاوانن
هۆكاری فەسادو ڕوخانی عورفی ئینسانن
ئەوەندە خەمخۆری حاڵی خۆتان نین
دڵ نەخۆش ئەژین لەكوێرەوەرین
چۆن خێرتان تیا بەدی كا خەڵكی
كەخۆتان ڕۆچوونە لەزۆنگاوی چڵكی

شوێن کەوتنی کافران و حەزوو ئارەزوو
ئەنجامی هەر تیا چوونە بەدرەگ زوو
خازۆ ڕەنجەڕۆ بەشت هەر دۆڕان بوو
هەرچی ووتت قسەی بۆش و بەتاڵبوو
لەوانەشە بەکەیف بیی و خۆت پێسەرکەوتو بی
ئێ وایە کەسی گێل هەرچی بکات دڵ خۆش ئەبی
دژایەتی ئیسلام بوختان و درۆ بەدەم ئاسانە
خازۆ ڕەنجەڕۆ بەڵام سزاکەی زۆر بەئێش و گرانە
خراپە کاری کە ئەیکەی مایەی ڕوخانتە
لەدونیاو قیامەت هەر سەرشۆڕی ئاکامتە
بیکە زۆری وەك تۆ گومڕابوو دژایەتی کرد
نەگەیشتە ئامانج و لەداخا رۆحی دەرچوو مرد
ئامادەیە دۆزەخ و ئەشکەنچە بۆ گومڕایان
داهاتوو سەرکەوتنیش بەهەشت بۆ خودا ویستان

-----------------------------------------

تێبینی: زاراوەی خازۆ زاراوەیەکی یۆنانیە واتە: گێڵ و هێڕ
بۆکەسێك بەکار ئەهێنرێ کە( گێل) بێت
1434 کۆچی بەرامبەر 12/12/10زاینی

# ئاسۆی گەش و پێناسەمان

**********************

بێ پێناسە!!

هەمووجیهان ئەمان ناسێ

مێژوو شایەدەو..

مرۆڤ لەئاستی ئەتاسێ ،

پاك وبێگەردو ئاشکرا

شەپۆڵ ئەدا!

وەك چراخان دائەگیرسێ ،

شەوبای هەساوە

درەختەکان ئەهەژەنێ ،

هەرتروسکە تیشکێك؟!

لەخۆرەوە وەرئەگرێ

ڕووناکیە !

هەموو سەردەم وکاتێ ،

ئەم ئاسۆیە ڕووناکیە!

بەهیچ پەلە ڕەشە هەورێ

بەهیچ گێژە گەمژە فیرعەونێ

بەر نەگیراوە، ناگیرێ ،

گەر بەم پێناسەش تێ نافکرن ؟!

ئەی ڵێینەوە!!!

هەریەکێکمان، چرای شەوین،

ڕوون وڕووناك وەك ئاوێنە.

پاك و بێ گەرد

ڕوون وگەشین،

سوپایەکەین!

ماندوو نەناس

بانگەوازی تەوحید ین ،

هەر یەکەمان!

دەنگ وڕەنگ

سەدای قورئان و سوننەتین،

شوێن کەوتەو قوتابیانی!

کەڵەپیاو سەرڕاستانی سەلەفین،

هەریەکەمان!

گرمەی تەکبیر....

بیلال وخەباب وموصعەبێکین ،

وەك وكوردێك!

بەڵام چۆن كوردێك؟!

موسڵمان و ڕاستگۆ

وەچە پاك

بەشەرەف و مەردین ،

وەچەی صەلاحەدینین

كوڕی باوكی خۆمانین ،

ئازاو دلێر چاونەترسین

دژ بەتاریكی جەهل

پیاوی ڕۆژین،

بە چڵكاوی بۆگەنی

خۆفرۆشی و علمانیەت!

ئاو نەدراوین،

حاشا، حاشا!!

سەت هەزار چار..

حاشا...

لەوانە نین،

لەئێمەش نین،

ئەوکەسانەی؟!

دین فرۆشن

خۆفرۆشن!

عەلمانینە!

ئەڵێن کوردین،

ئێمە ئەم کوردە !

سورشت پاکە گۆش کراوەین

بۆ گەڕانەوەی حوکمی خودا

وەك باپیرەمان تێ کۆشەرین ،

بۆنەمانی کوفرو ئیلحاد

شمشێرو گوللەی!

کاریگەرین ،

سوێند بەخودای پەروەردگار..

بەماڵ و سەر بۆ ئەم دینە..

فیداکارین...

سوپاس بۆخوا..

سوپایەکین،

هیوای ئازادی گەلە ،

ئاسودەی ین ..

سەرفرازین.

دادپەروەرین.

کامەرانین.

خۆشەوستین .

ڕەوشت چوانین .

مەبەستمان!

دەنگی حەق و ڕزگارییە ،

ئێمە ئەوەین کەئەزانن!

تێشومان پڕ..

موژدەی خێرو خۆشیە ..

تێشوامان پڕ..

موژدەی خێرو خۆشیە ...

---

1433کۆچی بەرامبەر 2012/8/25زاینی

## ئەم هۆنراوە بۆ جەنابی مامۆستا کرێکار نوسراوە کاتێك کەلە زیندان بوو

**********************

بانگەوازی ئەم دەنگی تەوحیدەیە وای لێکردوون کە نامۆ بێینە پێش چاوی خەڵکی!!! خۆ نامۆبوونمان لە خراپی نییە، بەڵکوو پەیوەستبوونمان بە ڕاستەڕێگەی ئیسلامەوە وای لێکردووین. ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) شایەتی بۆ داوە(عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ) (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) (بَدَأَ الإِسْلاَمُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ.) (مسلم: ٣٨٩). واتە: ئەم ئیسلامە بەنامۆیی سەرىهەڵدا و جارێکی تریش دەگەڕێتەوە سەر ئەو نامۆییيە، سەرفرازی بۆ نامۆیان. خوا لەوانەمان بکات! بەڕاستی مامۆستا گیان، ژیان لەسایەی ئەم ئیسلامە عەزیزەدا ئەوەندە دەهێنێت کە بۆی بژین و لەپێناوی بمرین. لە کۆتاییدا وەکوو سۆزێك ئەم هۆنراوە ئەکەمە دیاری و ئەڵێم:

هۆ برا گیان،

مامۆستای شیرین،

ڕێبوارەکەم،

ئەی بانگەوازی تەوحید،

پسپۆڕی ڕابوونەکەم،

جەستەی ماندوو،

نووزەی قوڕگی تینووە نووساوەکەم،

ئەی پزیشکی

حاڵی گەلە چەوساوەکەم،

دەنگی قورئان،

کێوی هیمەت،

دەنگی غیرەت،

سەدای جیهاد،

هێمای تێکۆشان و حەماسەت،

ئەمە کێیە

لە دروشمی تۆ

گومان ئەبا،

کە تۆ دەڵێی تەنها
حوکم و شەرعی خودا؟!
ئەگەر بێت و
هێڕ و گێژەکان
بیانزانیایە
بانگەوازی تۆ
سەرفرازیی
گشت دونیایە،
هەرگیز هەرگیز
لەئاستتدا نەیانئەوت
یەك وشەی تاڵ
نەك سزا و زیندانیت
بە چەندین ساڵ!!
سەرشۆڕ بن، بمرن
ئەوانە ی دژی ئیسلامن!
بەدڕەوشت و فەساد
لە دڵ و پشت یەکسانن
چی لە کوردستان،

چی لە ڕۆژئاوا،
کە زەوتکەری
حەقی ئینسانن،
کوا مافی مرۆڤ؟!
کوا دادپەروەری؟!
بانگەشەی درۆن
لە موسەیلەمەن
نەوەی شەیتانن
دڵڕەش و بۆگەن
لەپشت پەردەی ڕەش
بە ناو ئازادی،
خەڵك دادەبڕن
لە خۆشی و شادی
وەکوو گورگی هار
شەوگەڕ و سپڵەن
خوێنمژ و خائین
بە تۆسقاڵێکیش
نییە لە ناخیان

تۆزە ویژدانێ
بەڵام مامۆستا،
تۆ لە هەرکوێ بی،
دەنگی قورئانی
سەدای فەرموودەی
تۆ وەك بەهاری
گوڵێکی بۆنخۆش
بۆ ئەم ئیسلامەی
بۆن و ڕەنگی
کاریگەر و درەوشاوەی
باچاك بزانن،
دوژمنەکانمان
بەم حەقەیە
هەر دەستگرتنمان
بەکوێراییی چاوی
هەریەك یەکەیان
چوار دێڕە شیعر
لە نووسراوی خۆت

با بەس بێت بۆیان!

"قەسەم بە خوا لەڕێی دینی

ئەگەر تاغووتێکم بینی،

ئیمانەی دینی پاکم کا،

بە خوێنی تاڵ ئەکەم ژینی"

جا با بڵێن کە نامۆ

دێینە بەرچاوان،

نامۆبوونمان کە بۆ ئیسلامە

زۆر پێی سەربەرزین

شانازیمانە

موژدەی خۆشی

پێغەمبەری ئازیزمانە

(فطوبی للغرباء)

نامۆیی ناسنامەی سەرفرازیمانە

-----------------------------

قوتابیی خۆت،

بەندە عەلی هەولێری فێرگە

١٤٣٣ی کۆچی بەرامبەر ٢٠١٢/٨/١٩ی زایینی

# تۆ کە دڵنیای

*******************

پەخشانەشیعرێك بۆ ئەو خوشك و برایانەی کە حەق و ڕاستی ئەم ئیسلامە دەزانن بەڵام داخی گرانم کە شەیتان بە دونیا و نەفس هەڵیخلیسکاندوون و وای لێکردوون کە حەق و ڕێگای ڕاست لە خۆیان بشێوێنن بۆ ژیانی کەمی ئەم دونیایە تەوبە و گەڕانەوە دوا دەخەن؟!

ئەی خوشك و برای سەنگین،
هۆشیاربەوە!
لە خەوی غەفڵەتی ژین
تۆ کە دڵنیای...
لەپڕێکا ئەمری...
چی زوڵمێکی بەئەنقەستە
تەوبە ناکەی؟!
ڕێگای هیدایەت ناگری؟!

تۆ کە دڵنیای...

پەروەرێنت یەك خوادیە،

چی گومڕای و نەفامییەکە

ڕووت لە جەهلی ڕێچکە شەیتانەکانە

بۆ دوو ڕۆژی ئەم دونیایە

تۆ کە دڵنیای...

ئەو ڕۆحەی بەرجەستەتە

تەنها بە ویستی خودایە

چی دڵڕەقی و بێشەرمییە

بۆ پەروەردگارت سەرت

لە سوجدەدا نییە

تۆ کە دڵنیای...

ڕزق و ڕۆزی، چارەنووست

تەنها بە ئەمری خودایە

چی بێئەمەکی و شەرمەزارییە

سوپاس و شوکرانەبژێریت نییە

تۆ کە دڵنیای...
لە ناسۆر و ناخۆشیدا
تەنها خودا پشتوپەنایە
ماڵوێران خاکت بەسەر
بۆ تەنها لە تەنگانە خودات بیر دێ
بۆ هاوار و پەنایە
تۆ کە دڵنیای...
خودا چاودێرە لە هەموو کارێ کە ئەیکەی
چۆن لەڕووت دێ و ناترسی
گوناهـ و هەڵە و تاوان ئەنجام ئەدەی
دەی کە دڵنیا و خاترجەمین
برای بەڕێز خوشکی سەنگین
بۆ چەند ڕۆژێکی ئەم دونیایە
ڕۆژێ خۆش بێ...
دەیانی ناخۆشی لەڕێگایە!!
بۆ لەدەست دەین پاداشتی خودا
کە بەهەشتێکی نەبڕاوەیە

دەی تا زووە تەوبە بكەن چاكە پێشخەن
بە خوا قەسەم قەبر و لێپرسینەوە قیامەتێكی سەخت!
لەبەردەم هەمووماندایە
لەدەست خۆتە گەر بتەوێ بەهەشتی پڕلەخۆشی
یان دۆزەخێ كە ئازارێكی زۆر سەختی تیایە
برای بەڕێز، خوشكی سەنگین،
تا غەرق بی لە چڵك و گوناهی ئەم دونیایە
ڕۆژێ پەنجەی پەشیمانی بۆ ئەگەزی؟!
بۆ دەرچوونت لەم گوناھ و گێژاوەیە
دەی تا زووە تەوبە بكە،
كێ ئەڵێ ماڵوێران ئیمرۆ
سبە و بەیانی بەدوادایە
زۆرمان بینی وای ئەزانی ئەمێنی لەم دونیایە
هەرچی هەیبوو جێی هێشت..
ڕۆیشت ئێستا وا لەژێر گڵدایە
موحاسەبەی خۆتان بكەن بە خۆتاندا بچنەوە
پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێ
كە موحاسەبەی سەختی تیایە

ئیمڕۆ کە هەی بۆت دەرفەتە

لە خۆتا بەرجەستەکە

ئەم قورئان و سوننەتە...

ئاوا سەرفرازی عەزیزم لە دونیا و دواڕۆژ

ڕزگاریشە لە ئازاری قەبر و قیامەتە

هەستە و قۆڵی لێهەڵماڵە، خودا لە خۆت ڕازی بکە!

یەکێك بە لە ڕیزی ساڵحان!

لە ژیان و مردندا، سەرفرازی تۆمار بکە!

---

١٤٣٣ی کۆچی بەرامبەر ٢٠١٢/٤/١١ی زایینی، ئیتالیا

# ڕیشی پانمان ... داخی دڵتان

***********************

ئەم پەخشانەشیعرە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی کە سووکایەتی بە ڕیشی موسڵمانان دەکەن و نووسیویانە: "بە ڕیشی پان و پڕ لە ئەسپێ ... بناغەی ئیشی کوردان چۆن ئەچەسپێ؟". ئەوانە کە ئەسپێ لە ناخ و فیکری داون، تووشی هەزار نەخۆشیی کوشندە بوونە ڕیش لێیان بووە بە ئەژدیها لەسەر دڵیان! سەرۆک حیزبەکانیان چاکدەزانن موسڵمانان بەمردوویش ئەسپێ ناگرن، گەرچی ئەم ماڵوێرانانە بەزیندوویش بۆگەنن. لە شەڕەکان ئەم برایانەی ئێمە کە شەهید بوون، چەندین ڕۆژ لاشەکانیان نەدەنێژرا، بۆنی مسکیان لێدەهات کە ڕیشمان بۆن دەکردن، گەرچی ئەم مورتەدەماڵوێرانانە دیلەکانیان بەزیندوویش بۆنی بۆگەنیان لێدەهات و مردووەکانیشیان دوای کاژێرێك کرم دەیخوارد.

ڕیشی پانمان .. داخی دڵتان
ڕیشی پانمان .. جیامان ئەکات
لە ئێوەی بێدین و عەلمانییەکان
ڕیشی ئێمە هەر تاڵێکی پرۆژەیە بۆ دەوڵەتێ
ئیشی کوردان مەحاڵە و قەت ناچەسپێ؟!
بە سەری سوور و ورگزلێ
بە خاکفرۆشی دز، ڕابردوو پیسە، بەدفەڕێ
چۆن بناغەی کوردان ئەچەسپێ؟!
بە گەمژە و عەقڵ نەبوو لەسەرێ
مێژووتان زۆر پاك نییە!!
بە چی ئەنازن جێماوی کڵاو خرایە سەر
بە ٣٦ی ئاب، یان ٦٦؟؟؟!!!
یان بەخیانەت و فرۆشتنی خۆتی قوڕبەسەر
لە زبڵخانەی مێژوو، ئێوە فڕێ دراون؟!
بەڕووڕەشی و شەرمەزاری نووسراون
ئەم حیزبەی کە تۆ چەپڵەی بۆ لێئەدەی
بە نەسەقی هەڵەپەڕی و لووشکە ئەدەی،
چارەنووسی وڵات و میللەتەکەی

لە گیرفانی بنەماڵە و بابۆیە بەرهەمەکەی
تۆش هەر بۆی هەڵپەرە چوارپێی
تا ملت ئەشکێ و ساتمە ئەکەی!!
بەدبەختی نەزان؟!
لەبیرت چوو ئەنفال و کیمیاباران؟!
کردیانە ماچوموچ بۆ باوکی قوسەی
خوێنی ئەم کوردە هەژارە بە هەزاران
ڕیشی ئێمە بوو یان خیانەتی ئێوە
خستییە ژێرپێ،
ڕەنجی شۆڕشی کورد و هەموو شەهیدان
کە ڕیشی پانی ئێمە بۆتە بەردێك لەسەر دڵتان
هێشتان ماوە پان و درێژتر ئەبێت بەکوێراییتان
لە مێشك و خوێنی خۆتانە، ڤایرۆس و ئەسپێ!
بۆیە تێنافکرن، داماوی چوارپێ؟
ئێمە کەی زۆر زۆر چڵکن بین،
زۆر پاکترین لە تۆ و حیزبەکەت کاکە پوشێ

چونکە ئێمە پێنج جار ڕۆژێ
دەستنوێژ ئەگرین!!
سوجدە ئەبەین تەنها بۆ خودایێ
بەڵام تۆی چڵکن و بەکتریا و بۆگەن
لە خوار شانان گومڕا و وێڵی ونە ڕێگایێ!
سەر لە سوجدەی بۆ شەیتانێ،
خوداویستان لەژێر خاکیش
بەمردوویی لاشەیان ئەسپێ ناگرێ
ئێوەی بۆگەن لەسەر خاکیش
بەزیندوویی بڵێین ئەبێ،
خۆزگەمان بە هەزار
ئەسپێ و قرنە و ئافاتێ!

---

١٨ی جومادی دووەمی١٤٣٣ی کۆچی
بەرامبەر ٢٠١٢/٥/٩ی زایینی

# یادێك بۆ شەهیدان

******************

لە ٢٠٠٣/٤/٣ محرەمی ١٤٢٤ کە ئەکەوێتە رۆژێکی وەک سبەی مامۆستا {عبداللە }ی قەصریێ لەگەل ئەم برایانەی کە لەگەلی بوون (کاک سیروان و کاک عەبدولجەبار و کاک مەلا ئەحمەد و شێخ توانا)، کەوتنە بۆسەیەکی مورتەددانی سەرانی یەکێتی لە بازگەی تاسلوجە زۆر زالمانە کوژران خوا بەشەهید قبولیکربدن، لەهیج و خۆرای دەوریان دان بەهێزێکی زلەوە لەهەموو لایەک دەسترێژی گوللەیان لێکردن وەک پیشەی هەموو جارێکیان،، خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانی خۆت بۆسیفەتە بەرزەکانی خۆت بکوژان و مورتەددان ریسوا بکەی تەفرو تونایان بکەی هەروەک جۆن سەرانی پێش ئەوانەت ریسواکرد، خوایە ئەوانە دەستیان سورە بە خوێنی حافیز قورئانەکانی تۆ، خوایە گیان جێ پێیان لەق بکەو ڕاچەمانیان تێ بخە هەروەک چۆن ریسوات کردوون ریسوا تریان بکەی یا اللە یا اللە یا اللە یا رب العالمین

اللهم منزل الكتاب ، سريع الحساب ،اهزم الأحزاب ،اللهم اهزمهم وزلزلهم . اللهم إنا نجعلك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم} . خوایە دابەزێنەری قوریان، حیسابت خێرایە، حیزب و کۆمەڵە بێ باوەڕەکان بشکێنە، خوایە شکستیان پێ بهێنەو جێ پێیان لەق بکەو ڕاچەمانیان تێ بخە .

منیش وەک یادێک و وەفایەک بۆ ئەم برا شەهیدە عەزیزانەئەم شیعرەی شەهید کۆساریم بەدەستکاریەوە ئامادە کرد خوای گەورە لەریزی شەهیدانی بەدرو حونەینا حیسابیان بۆ بکات ان شاالله،

هیچ جوتیارێکتان بینیوە
عاشقی قەدی گیاکەڵە بێ و،
گوڵە گەنم بفەوتێنێ؟!

هیچ ڕێبواری واتان دیوە
چەنگی تاریکی خۆش بوێ و
ڕووناکی ڕۆژ ببوغزێنێ؟!

هیچ شوانی ئەوینتان دیوە
عاشقی سەگی گورگە مێش بێ و
خۆی لە مێگەل نەگەیەنێ؟!

هیچ پێشمەرگەتان بیستووە
چەکی دەستی ئیستیعمار بێ و
ئاوایی خۆی بڕەخێنێ؟!

من ڕێبوارێکی غەریبە و
دەستی دڵم توند کردووە
لە دامێنی شەقاوی تۆ...

لەناو سەت داو،
بەس کەمەندی بەتاوی تۆ...
لەناو حەفتا و سێ دروشم و لافیتە و ناو،
بەس پەڕاوی پاراوی تۆ.....!

ئێوە ڕێبوارێکی ماندووی
ماندو نە بووی ئەم رابونەن
مەلی خۆشەویستی ڕۆحیتان
لە قەفەسی دەروونمدا
هەڵنیشتووە و،
جێی یەکجاری خۆش کردووە
جار جار بە دەنوکی وشتی،
یەخەی دڵم دەجوڵێنێ...

هەرکە نوستن لە پشتەوە دوو چاوی گرت،

ئەمیش بەخەبەری دێنێ

ئەوینی تۆم .......

وەک ئەویندار.....

وەک و گەردنی کاک(عبدلجبارو ،شێخ تواناو، کاک

سیروان) و

باسکی تەنافی ستەمکار..

وەکو نەزەری ئارپیجی

چاوی سەنگەر،

وەک برینی دەور چۆڵی

(مەلا ئەحمەدی)ی چاڵی چەڵەوان،

وەک (مامۆستا عبدالله قەصری)ی کاکۆڵ خوێناوی سۆران

وەک برینی هەتوان و،

دەروونی بەندە و قورئان و،

بەربانگ و دڵی ڕۆژووە وان....

خۆشم دەوێی،

لێت جودا نیم

من مۆم و

ئەتۆش دەزولە ...!

تۆ فانۆس.....!

منیش پەپولە....!

ئەتۆ هیزر و هەست و گیانی

گیان و جەستەم برای گیانی

بەبێ تۆ دانویان ناکوڵێ و

بە دووری تۆ

ئەوانیش لێک دەترازێن و

بۆ دواین جار

ماڵئاوایی لەیەک دەکەن.....

بە بێ تۆ ژینم باوکی ژانە

وەک هەنگ و گوڵ،

یا خوێن و دڵ،

یا چاو و فرمێسکی بەکوڵ...!

خۆشم دەوێی،

خۆشەویستیت گێچەڵێکە و

لە دونیادا

یەخەم دەگرێت...!

خۆشم دەوێی،

خۆشەویستیت،

دڵنیامە لەسەر ڕێگا

چەقۆیەکە و سەرم دەبڕێت

خۆشم دەوێی

خۆشەویستیت،

وەکو هەر پێنج هەڵۆیەکەی

(تاسلوجە)*

خاتر جەم بەرەو مەرگ باڵان دەگرێت....!

خۆشەویستیت

با زۆر تۆری دانراویش

لاقی بگرێت......

با زۆر ئەڕقەمی دووپشکەش

لەسەر ڕێگا پەنجەی یەکپەرستی

ببڕێت....

با زۆر نەمرووود ومورتەددانی یەکێتیش

نەواری تەمەنی بسڕێت...

دۆڵێک، گردێک، هەر دەڕەخسێت
وێنەی هەر پێنج کۆترە مل بە خوێنەکەی
بازگەی (تاسلوجە)**
لە باوەشی گەرمی بگرێت...
گردی سەیوانێک هەر دەبێت،
وەکو هەر چوار خوشکە لەچک پەمەییەکان
وەکو چوار تۆقەی گوڵ بەدەم
لە سیمەن و قژیان بگرێت....
ئەوە کۆساری هۆنراوەکانی بۆ ناردن
چاک دەزانم
یەک بە یەکی وشەکانی لەت دەکرێت و،
لە تەوێڵی مەحەک دەدرێت....
ئەوسا،
یا پێخەوی گڕە،
یاخودوەک ئێوە بە شەهیدی دەمرێت...

---

ئەم هۆنراوە لە یادی مامۆستاعەبدوڵڵای قەسرێ و برایانی نوسراوە

ئەم هۆنراوە پێناســـەی نامۆ بوونمانە لەم ڕۆژگارە .بانگەوازی ئـەم دەنگی تـەوحیـدەیـە وای لێکردوون کە نـامۆ بێینە پێش چـاوی خەڵکی!!! خۆ نـامۆبوونمـان لە خراپی نییە، بەڵکوو پەیوەستبوونمان بە ڕاستەڕێگەی ئیسلامەوە وای لێکردووین. ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) شـــایەتی بۆ داوەو فەرموویەتی (بدا الاسلام غريبا وسيعود كما بدا غريبا فطوبى للغرباء ) (مسلم) واتە: ئەم ئیسـلامە بەنامۆیی سـەرىهەڵدا و جارێکی تریش دەگەڕێتەوە ســەر ئەو نامۆییە، ســەرفرازی بۆ نامۆیان. خودا لەوانەمان بکات!

## هۆنراوەی غەریبێکی نامۆ

*********************

غەریبێکی
دووره ووڵات!
غەریب بوونت ئەوەنیە؟
دووربیت لەخاك یان لەووڵات
کەس وکارت نەبێ لەلات !!
غەریب بوونت
ئەوە نیە کە کۆچ ئەکەی
بەووریای بەئاگایی
بۆ ووڵاتان .ڕێگا.. ئەکەی
عەزیزی من غەریبی تۆ
بەحەقەوە دەست گرتنە
چەسپاو ، دڵ دامەزراو
لەدنیادا پشت کردنە
عەزیزی من غەریبی تۆ
نزیکەکان ناگرێنێ
خۆشەویستی

هەستەکان نابزوێنی

غەریبی تۆ

هەڵدە بژێرێ

ڕووخاوەکان تورە ئەکا

توندیان ئەکا

پەست و مەست

ڕقن و زویر لاساریان ئەکا

لەجیاتی دڵ نەرمی و گریان

بەسەر سەردا هاوار ئەکا

دژایەتی، تانەو تەشەر

چاویان بەبینیت هەڵناکا

گوێیان بە بیستنت

حەز...ناکا

ئەی غەریبم

باشە بۆچی وات لێ ئەکەن ؟!

تۆی ڕێبواری ڕێگای حەق.

بۆ ئاوا . دژایەتی ئەکەن !

خۆتۆ هەر تۆیی..

خۆ هەر خۆتی غەریبەکەی!

بۆ چی زیاتر تەنیای بەسەرتا دێنن.

نامۆو سەیر ؟

ڕەق و ووشك هەمیشە وا ئەتبینن !!

ئەڵێن توندی ، ناپەسندی ؟

کەچی هەتا دوێنێ !

هەر ئە تۆبووی ؟!

لەفەرهەنگیان پاك وچاك و ئەفەندی .

ئێستاش نامۆ وخراپ و نەنگی

عەزیزی من .

خۆ نامۆ بونت لەخراپی نیە

(فطوبی للغرباء )

ناسنامەی سەرفرازیە

ئیتر بازیز بن لێت ..

با پیس بن لێت...

بابن بە بۆسەو گولە بارانی ڕێت

خۆت چاك چاکی ..

هەر خۆت پاکی ..

ووتەکانت زۆر ڕەنگینە

ئاداب و هەڵسوکەتت

دین داریەکی زۆر سەنگینە

جا هەروابە.چەسپاو .دامەزراو

گوێیان پێ مەدە

تاکوئەخنکێن لەزۆلگاوی ڕق و قینە

چائەبینین لەداهاتوو دا

ئەوەی ڕەزامەندی خودای بەدەست هێناوە

ئەوەشی ڕەزامەندی خودای کە لە دەست داوە

---

6 جومادی یەکەمی 1437 کۆچی

بەرامبەر 2016/2/14 زاینی ئەسینا /یۆنان

# کابرای کڵاوسوور؟؟

★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★

بەبۆنەی سەری ساڵی زاینی .
بۆمنداڵانی خۆیان!
دیاری و شیرینی بەخشی
بۆمنداڵانی ئێمەش؟!
ئاگروئاسن دوکەڵی تاڵ
دەستو قاچی قرتاو
بەرگێکی خوێنینی نەخشی
پیری کڵاو سوور
منداڵانی لای خۆیانی!!
بەقا قا هێنا پێ کەنین
منداڵی ئێمەشی هێنا سەر؟
ترس و گریان .باوەشی ڕق وقین
منداڵی ئێمەی پەرتەواز؟؟
بێ نازو بێ ماڵ و ژین..
منداڵی خۆیان لەگەرمە جێگا
منداڵی ئێمەش !

ئاهوو نزوولەی بێ جێگا ..
منداڵی خۆیان
پۆشتەو تێر و ڕازاوە..
منداڵی ئێمەش !
یان بێ قاچە،یان بێ دەستە
یان سووتاوە و سەربڕاوە
ئەی بێ شوان و بێ نازەکانم
تۆ بڵێی ئەوانەی
باسی مافی مرۆڤ ئەکەن
تەنها لەگۆشەی خەونێکا
تی لە چاوێك لەتۆ بکەن ..
نا ..نا .. ڕۆڵە گیان ؟!!
تۆ جونکە موسڵمانی
خوێنت هەرزانە ..
لەباوەشی رق و قینی ئەوانی..
پیری کڵاو سوور ؟!
تۆش ڕێویە سوورەکانی مارکسی..
کینەی سووری خاج پەرستی..

دڵنیابە . هەرچەندی دەنگم کپکرێ
بای نووزەیەك هەر ئەمێنێ !
هاواربکا وبڵێ...
واسلاماه ..واسلاماه
تا .سەربازانی خودا ئەگات
تەخت وتاراجتان ڕامالێ ..

----------------------------

17 ڕەبیعی یەکەم 1437کۆچی
بەرامبەر 2015/12/28زاینی،ئەسینا / یۆنان

## بروسکەو

## تروسکەیەك لەزیندانەوە؟!

*****************

چیت بۆ باس بکەم
براکەم؟!
خودا ویستیم .
بێ تاوانیم .
یان حەق وستیم ..
چیت بۆ باس بکەم
براکەم ؟!
زامەکانی سەر جەستەم .
کەساڵانێکە لەگەڵ زنجیرا..
هاوڕێ . ڕۆژگار بەڕێ ئەکەم
یان حاڵی جومگەکانم
کەلە ئەشکەنجەو زیندانە ..!
شیتاڵ بوونە .
گشتی لەیەك ترازانە .

چیت بۆ باس بکەم

براکەم؟!

چڕو جانەوەری ژوورەکەم

شێی دیوار.

لێ دانی دڵی بەخورپەم ..

یان چرکەی میلی سەعاتەکم

کەتەوەری لێ تێکچووە ؟

هەرچەندە ژماردنی

کاتەکانی لەبیرچووە

بەڵام هەر بۆم ئەدوێ

لەسەرەخۆ هەستە برا...

کاتی نوێژە.

دەست نوێژ گرە

(سوجدە) بۆ خودا بەرە .

چیت بۆ باس بکەم

براکەم ؟!

زۆر کەس ئەڕۆن ودێن

لێرەو لەوێ..؟!!

یان برای دینی دوێنێن !

یان بەناوی مافی مرۆڤ ئەدوێن

ئەڵێن هەستی سڕمان

ئەگرنە خۆ ؟!!

کەسەیرمان ئەکەن

لەگەڵمان دێنە گریان ؟؟

بەڵام هەر کەئەڕۆن

هەمووشتێ لەیاد ئەکەن ؟

چیت بۆباس بکەم

براکەم ؟!!

ئەوکەسەی هەتا دوێنێ.

ڕقیان بوو لەستەمی بەعس ؟

ئیمرۆ بۆمان دێتە پێشێ ..

زۆر زاڵم تر خۆ ئەنوینێ

لەهەندێ باس؟!

ڕەنگە زۆرتان بەرگوێ کەوێ !

ئەمان کەن بەئیرهابی و کەساس.

خۆشیان ئەکەن بەپیاوی چاك .

کوردی ڕەسەن کوردی خاس
هەرگیز نەکەن بڕوابکەن!
ناپاکێکی نامەردن...
نمرەدارن ...
چەقی درۆ و دزین
سەرچۆپی خۆفرۆشانن
بەڵام براکەم ؟!
ئەوەی گرنگە بۆت باس بکەم
لانەدانە لەبیرو باوەڕم
چونە ڕیزی سەرفرازان
ڕەزامەندی پەروەردگارم
درەنگ و زوو ڕۆژێ دێ!!
ئەم ئیسلامە
وەک گزەنگی تاوێ
لەهەموو لایەك
پڕشنگان داوێ...

ئەوکاتە ئەگەر لەجەلادەکانتان پرسی .

ئەهلی (تەوحید) کێ نە !!

پێتان ئەڵێن !!

کێ نە؟!چۆن وچین ...

-----------------------------

30 ڕەبیعی یەکەمی 1437 کۆچی

بەرامبەر 2016/1/10 زاینی یۆنان

هۆنراوەی: بروسکەو تروسکەیەك لەزیندانەوە؟

ئەم هۆنراوەیە پێناسەی هەموو دەنگی ئەهلی تەوحیدە پێناسەی هەموو قوتابیە ئەخلاق پاکەکانی قوتابخانە یوسفیەکەن کە بەبێ تاوان لەزیندانە تاریك و پڕناسۆرو لەئازارەکانی سەرانی زوڵم و ناحەزانی ئیسلام دا تەمەن بەڕێ ئەکەن ، هاوار بەحاڵمان بەراستی زۆر بەداخەوە کەزۆرێکمان ئەم عەزیزو مەزڵومانەمان پشت گوێ خستووە فەرامۆش کردووە،لەکاتێکدا ئەزانین کەچۆن بەپێست وئێسقان ماونەتەوە .

خودای گەورە ئازادیان بکات . خودایە بۆخاتری هەموو ناوەجوان وسیفاتە بەرزەکانی خۆت خودایە لێت ئەپاڕێینەوە لەم غوربەتە لەتۆ زیاتر کەس نیە بەناو هاواری بۆ بەرین خودایە تۆڵەی ئەم کەسە عەزیزانەمان بسێنیەوە لەسەرانی زوڵم خودایە ڕیسوابوونیان بەچاوی سەر ببین یاالله یاالله یارب العالمین

# ئەی مامۆستا ئازیزەکەم

******************

ئەی پێشمەرگەکەی ئیسلام،
مامۆستا عەبدوڵلا خواویستەکەم
ئەی دەنگ و سەدای قورئان،
مەشخەلی ڕابوونەکەم
نەوەی سەلاحەدینی باپیرە، ئەی موجاهیدە دڵسۆزەکەم
ئەی بەناحەقکوژراو، قەڵەمی ڕاستگۆ،
بانگەوازخوازەکەم
ئای! چەند تامەزرۆی گەیاندنی
دەنگی ئەم ئیسلامە بووی
بۆ سەرخستنی ئەم پەیامە ڕوون و پاکە
زۆر ماندوو بووی
دژبە ناحەزانی دین بەچەك و قەڵەم،
بەدەنگ لەسەنگەر بووی
ڕۆژانی جومعە لە مزگەوتی قەسرێ و سۆران
تۆ ئیمام بوو

ئەتگووت بە خوا قەسەم لەیادی ناکەم
زەحمەتی پێغەمبەری خودا
باوکی موسلیمیش ئەمەیە ڕێبازی
تا ڕۆح لە جەستەی مابێ و هەناسە بدا
چونکە ئەم ئیسلامە بەغەریبی هاتووە،
ئەگەرێتەوە بۆ نێو غوربەتدا
ئامۆژگاریشت بۆمان
هەریەکگرتن و برایەتی بوو لەگەڵ یەکتردا
یادت بەخێر ئەی موسعەبە بۆنخۆشەکەی
ئەم سەردەمەمان
قورئانێك بووی
بۆ خۆت بەڕێگادا لە شارو دێهاتی کوردستانمان
ئێمە لەبەر خاتری خودا خۆشمان ئەویستی،
جێی شانازی بووی بۆ هەموومان
لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوورەتی (التوبه) ڕاتئەهێنایین
یەك-یەکەمان
خۆزگە وەك تۆ ڕووناکیی قورئان و سوننەت
دڵ و سیمامان گرێت

لەیادمە پێتئەگوتین ئەی دیدی نوێ
تا نەمامی باوەڕ بەرهەم دێنێت
ماندووبوون و شەونخوونی ئەوێت
ئەبێ خوێنێکی زۆری لەژێر بکرێت
بۆ حاکمبوونی قورئان و سوننەت
ئەنجامەکەی هەر ئەبێ شەهیدی بێت
ئای چەند پێویستی بە پیاوی لەخواترسی
وەك تۆ هەبوو ئەم کوردستانە
بەڵام ناحەزان داخلەدڵ و گومڕاکان
شەهیدیان کردی بێویژدانانە
تۆ ڕۆیشتی لەگەڵ براکانت گەیشتن
بە سەلەف و کاروانی ساڵحانە
بێ گومان خوای پەروەردگار تۆڵەتان
هەر دەسەنێ لەو بکوژ و زۆردارانە
پەیمان بێت ئێمەش دوای ئێوە
هەر قورئان و سوننەت ڕێبازمان ئەبێ
ڕەحمەتی خوا لە تۆ و هەموو شەهیدانی
ئەم ڕابوونە ئیسلامییە بێ

خوایە گیان، بۆ ناوە جوان و سیفەتە بەرزەکانت
بۆ هەموو شەهیدانێ
وەك شەهیدانی بەدرو حونەین لەگەڵ
هاوەڵان حیسابیان بۆ کرابێ

---------

ئەم هۆنراوەیە پێشکەشە بە مامۆستا عبداللە قەسرێ

## پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم)

*************************

ئەی پێغەمبەری خودا ئەی‌خۆشەویستر لە گیانمان
نوورو ڕوناکی و ڕێز ئەی پێشەواو سەروەرمان
ئەی سەرکردەی بێ وێنە خەمخۆری مرۆڤەکان
فێرت کردین جۆن بژین بەخۆشەویستی وئیمان،
پەروەردەت کردین لەژێر تیشکی ڕۆشنای قورئان
ئەی پێشەوای مرۆڤایەتی ڕووناکی چاومان،
فەرموودەو ووتە جوانەکانت کانیاوێکن لە هەنگووین
هەتا بێ و نۆشی کەین دەرمانە بۆ دەردەکانمان..
هەرتۆ بووی حەق و ناحەقت بۆ لێک جیاکردین
تاریکی و نەفامیت لەسەر لابردین
ئاوات فێرکردین هەروەک گولێک بین
بۆدەورەبەرمان بۆنخۆش و چوانبین
ئازەیەتی و راست گۆی و خورەوشت جوانیت
بۆ بەرهەم هێناین
بەدروەشتی و ناپاکی و ستەمەت بۆ لەڕیشە دەرهێناین

ئەی خۆشەویستمان ئەی ووزەی گیانمان
بەرێزترین بەشەر لەهەموو جیهان

بەلێن ئەدەین تا شەهیدبوون پەیمان بێت پە یمان
بۆخۆت و پەیامەکەت پێشکەشە ماڵ و گیانمان

یاخوا سەلام و درووودورەحمەت برژێ بەسەرتا
بەقوربانت بین بەدایک و باوکمان
ئەی دڵ وگیانمان پێغەمبەری خوا

# شەهیدانی ئیسلام

********************

ئێوەی ڕاستگۆ جیهانی خۆشەویستیتی
ڕاستەقینەتان بەدی کرد
بۆ گەیشتن بەخۆشەویسترین خۆشەویست
گیانی خۆتان فیدا کرد

لەسەرفراوانترین باڵی بەرزە
فڕدا ئەم جیهانەتان بەرێ کرد
لەگەڵ ڕەنگە جوانەکاندا
گەرمە سێری بیابانتان وون کرد

ئێوەبوون وەفاداری و سۆزو
بەزەیی و ئازەیەتیتان نمایش کرد
لەسەر پشتی ڕووناکیدا دڵۆپ دڵۆپ
تاڤگەیکتان درووست کرد

ئەی ڕێبواری ڕێی پەپولان وناسکترین
زەردەخەنەی ژوانان

ویژدانە خەوتوەکانتان
بەئاگا هێناو سۆماتان دایە  چاوان
ئای چەند سەرفرازن
هاوڕی لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان
هەمیشە زیندوو
لەلای پەروەردگارتان لەبەهەشتی نەبڕاوەدان

بینیمان ڕووخساری جوانتان چەند ئاسوودەن.
چەند شادومانن .
بەنایابترین زەردە خەنە
وا لەبەهاری هەمیشەدا پشوو ئەدەن

لەخودای گەورە داواکارین
ئەم پلە بەرزەیە بەئێمەش ببەخشێ
وەکو ئێوە بەندەی سەرفراز.
لەدەرگای (جیهاد) بچینە بەهەشتێ

شەهید کێیە : شەهید ئەوکەسەیە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاماژەی پێکردووە فەرموویەتی(من قاتل لتكون كلمة الله أعلى فهو في سبيل الله)(صحيح مسلم) واتە ؛هەرکەسێك تێکۆشان و کوشتار بکات لەپێناو سەرخستنی تەوحید.بۆ ئەوەی ووشەی خودا کە (لا اله الا الله) بەرزبکاتەوە سەربخات بەسەر هەمووبەرنامەو ڕێساو یاساکان ئەوە لەپێناوخودای گەورەیەو ئەوکەسەبکوژرێ شەهیدە،نەوەکوهەرچی کوژرا ناوی شەهیدی پێ بلەکێندرێ .کابرا بۆتە کەواسووری پێش سوپای کوفر بۆ سەروەری و سەرخستنی شەلاتێتی ئەمریکا و عەلمانیەت ومافیای نەوت و دۆلارو بێ دینی پێش سوپای خاچ پەرەست وجولەکە کەوتبێ بۆ (موسلمان کوشتنیش) ،فووی پیاکەن بڵێن دەی بڕۆ ئەگەر کوژرای شەهیدی ئەوەشەهید نیە ئەوە زەندیقە و سەرەتا مافی بەئیسلام نەماوە لەپێناو کوفر کوژراوە... پلەوپایەی شەهید لەپێناو خودای گەورە زۆرگەورەو بەرێزە ،پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی:(للشهيد عند الله ست خصال: يغفر له في أول دفعة، ويرى مقعدة من الجنة، ويجار من عذاب القبر، ويأمن من الفزع الأكبر، ويوضع على رأسه تاج الوقار، الياقوتة منها خير من الدنيا وما فيها، ويزوج اثنتين وسبعين زوجة من الحور العين، ويشفع في سبعين من أقاربه). ترمذی.. ابن ماجه . حديث صحيح.

واتە ؛ بۆ شەهید شەش تایبەت مەندی هەن ،یەکەم لەگەڵ یەکەم دڵۆپ ڕژانی خوێنی خودای گەورە لەهەمووتاوانەکانی خۆش ئەبێت ،دووهەم شوێنی خۆی لەبەهەشتدا ئەبینێ ،سێ هەم؛ لەسزای گۆڕ پارێزراو ئەبێت، چوارەهەم؛ تاجی ڕێزو شکۆ ئەخرێتە سەری .یەك مراواریش لەم تاجەیە باشترە لەدوونیاو لەهەرچی لەدونیادا هەیە،پێنچەهەم ؛حەفتاو دووحۆری پێ ئەدرێ .شەشەهەم ؛نزا ئەکات بۆ حەفتا کەس لەنزیك خزم وکەسەکانی .. خودای گەورە ئەم پلە بەرزەمان پێ ببەخشێ اللهم امین .

---

1 ڕەبیعی یەکەمی 1438 کۆچی
بەرامبەر 2016/12/1 زاینی
میلانۆ ئیطالیا

# خوێن و فرمێسکی ئەهلی سوننە

************************

سـاروخ بارانـه
خـوێن پڕژانـه
دار سـوورـبوه
بـەردسـوورـبوه
کوچەکۆڵانی شـار
جۆگەی خوێنەو
کاول بووه..
ژن وپیرو منداڵ
بێ ژمار...!!
لـەشی بێ دەست و قـاچ ؟؟
سـەری بێ لـەش کـەوتوه
خـوێن بارانه ..
فـرمێسك وخـوێن پڕژانه
قـرچەی ئاگرو ئاسن
کڵپەو پڵێسەو سـووتانه
ئەی کـەسـوکاری مـەزڵومم
باش گوێبگره ؟!
باش سـەیرکه !!

ڕق ودڕندایەتی ناحەزانت
سەردەمێکە تازە نیە!!
لەفەرهەنگی ڕەشی ئەوان
ماف وخوێنت نرخی نیە.
بۆیە ئەبێ باش بزانین
تەنها جیهادو تێ کۆشان
مایەی بوونەو ڕزگاریە

--------------

1 ڕەبیعی یەکەمی 1438 کۆچی
بەرانبەر بە 2016/12/1 زاینی
میلانۆ ئیطالیا

ئەم هۆنراوەیە دەنگو ناخی پڕفرمێسك وپڕ خوێن کراوی کەسوکاری سوننەی مەزڵومانە لە لەعێراق ولە شام کەڕۆژانە وەکو باران ئاگرو ئاسن ئەبارێنرێتە سەریان،.هەموو دونیا زمانی قووت داوە کەس مەتەقی لێ وەناییێ !! لە بەر ئەوەی موسڵمانین خوێنمان بێ نرخ و هەرزان سەیر ئەکرێ ،خودای گەورە تۆڵە لەسەرانی کوفر بسەنێتەوەو ڕەچامانیان تێبخات

## دووژمنانی ئیسلام لەگشت لاوە دەوریان داوە

*****************

وائەمچارەش هەمووكوفر

گشتی یەك هەست

بوونەوە یەك

دەست لەنێودەست

بەیەك دەنگێ

لەلایەكە ؟!

جولەكەیە

ڕافیزەیە،

خاچ پەرستێكی

صەلیب لە ملەیە

تەرەفێكی تر لەوبەرەیە

مورتەدێكی موحاریبە

خۆفرۆش و سەركزەیە

موبتەدیع ێكی دین فرۆشیش

موعەمەمە!!

جلی کوردی لەبەردایە
جامانەیەکی لەسەرنایە
خۆفرۆش وخزمەتکارە
هانیان ئەدا
هاوار ئەکا؟! کەگوایە؟!!
وەلی ئەمرێ دینیش بێ
گوێڕایەڵی هەر ڕەوایە
لایەکی تریش والەوبەرە
لەسەنگەرە
ئاڵای سووری کۆمەنیستە
چەکوش و داسی لەسەرە ،
لەفەرهەنگی ئێمە ..
هیچیان هیچ نین ئەمانە
بەرامبەر ئەهلی ئیمان
داهاتوویان یان تیاچوونە
یان دۆڕانە ...

ئێمەی ئەهلی تەوحید

تەوکل و پشت وپەنامان

تەنها ...تەنها ..خودایە

شەهیدبون یان سەرکەوتنمان

هەردووکیان سەرفرازین ....

لەقیامەت ودونیایە

هەریەکەیان..!

گەورەترین پاداشتی خودایە

لەوەبێ بێ باکین

کە دوژمنی ئاشکرایە

ئەوەی دوژمنی سەرسەختە

بەناو زانای دین فرۆش و

دووڕوێکی ناڕەسەنە

گوایە چاڕی حەق ئەدا

بەلام لەراستیدا شاهێدی

بەشانی کوفر ئەدا

هۆی ئەمەیە ؟

لاوازبوونمان لەم زەمانە
ناپاکی بەناوزاناو
دووڕوو وانە
کە ووتەیان، ژەهری پەڕە
خەنچەری دابانە
ئەمانە بیری کڵۆڵن
لەخزمەتی بەرەی زۆڵن
بۆیە ئەبێ ڕیسوابکرێن
بۆیە ئەبێ
هەجری بکرێن
ئەی ئەهلی حەق
پێش هەمووکەس ئەمانە ڕیسوابکەن
ئەمانە هەجری بکەن
موسڵمانان لە فیتنەیان
لەزمانیان رزگار بکەن...
موسڵمانان لەفیتنەیان
لەزمانیان ڕزگار بکەن

ئەم هۆنراوە؛ پێناسەی ئەم سەردەمەیە کە دوژمنانی ئیسلام کۆبونەتەوە، نەخشە دەکێشن، هەنگاو دەنێن، قۆناغ دیاری دەکەن، هەموو شتێک دەکێشن، ئەوجا کار دەکەن یان هێرش دەکەن، ئەهلی تەوحید لەهەموولایەك پیلان لەدژی ئەسازێنن ، وەکو ئەبینین کافران و مورتەدان و کلکەکانیان بەهەمووهێزو چەك توانایانەوە هاتنە سەنگەر لەدژی ئەم ئیسلامە عەزیزە، ئەوەشی لەهەمووی سەرسەخترە گووفتارو ووتارو فەتوای سەقەتی هەندێ بەناو زاناو موبتەدیع و کلکەمەلای خۆفرۆش و دین فرۆش و بیدعە چیە کەڕیشیان لە زمانیان درێژترە دژی ئەهلی حەق و لەدژی ئەهلی حەق ئەگوزەرێن و بوونەتە کەواسووری پێش سووپای کافران وهاوشان لەگەڵ مورتەدان بە فەتوای سەقەت خەڵک گومڕائەکەن و دژی ئەهلی تەوحید وموجاهیدان سڵەی ناکەن،شوێن کەوتنی کوێرانەی ئەم کەسە بەناو زانایانەی ئاخیر زەمان خەڵکی گومڕا ئەبی، جونکە ئەو ئایەت و فەرمودانەی کە لە ڕواڵەتدا شوبهەیان تێدایە، (متشابە)ن و چەند تەفسیرێك

هەڵدەگرن، و خەڵکی پێدەخەنە گومانەوە و گومڕایان دەکەن. بۆیە پێویستە هەجری بکرێن ئەمانە خودای گەورە تۆڵەیان لێ بسەنێتەوە لەوە زیاتر ریسواوزەلیل تریان بکات لەدونیاوقیامەت .بەراستی ئەمانە بەڵای ئەم ئومەتەن

19/ڕەبیعی یەکەم-1438 کۆچی

بەرامبەر بە 2016/12/19 زاینی

## نامەیەك لە مردووەوە بۆ زیندوو

*****************

ئای کە ئەبیستی
ئاهوو بانگی من!
لەناخی زەوی
پەشیمانی من
بێ نازوو کڵۆڵ
بێ هیواو مۆڵەت
وای بەحاڵێ من
بۆ یەك چاکەیێ
بۆ تەنها نوێژێ
ئاوات ئەخوازم
بەوەی تۆ ماوتە
ئێرەی ئەبەم ؟!
نا پارەو سامان
نا پلەو پایە
بەهیچ ئەمانە
حەسوودی نابەم
بەکاتەکانت
ئێرەی ئەبەم
خۆزگە یەك خولەك
بدرایە بەمن

لەوەی تۆهەتە
بێمەوە دونیا
نوێژێ ئەنچام دەم
ئەی بەندەی زیندوو
منیش وەکو تۆ
نەبوو لەبیرم
مردن و ڕۆڕۆ
گەرچی لەپڕدا
کەوتە نێوانم
مردن و قەبر
خۆڵ و تاریکی
بوونە دواماڵم
ئەی بەندەی زیندوو
وەرگرە ئامۆژگاریم
فریای بەهاری تەمەن کەوە!
تاسیس نەبووە
وەکو تەمەنی پایزی من
دوای بێ سوودە...
پەشیمانی و شیوەن

بابهێنینە خەیاڵی خۆمان کە مردوویەك لەمردووان نامەیەك بۆ ئێمەی زیندوو بنێرێ ؟!! ئای ئەبێ ئەو مردووە چی بنوسێت؟ وە بە چ زمانێك گوزارشت ئەکات لەو پەیامەی کەئەیەوێ بینێرێت بۆ کەسێکی زیندوو کە چێژ وەردەگرێت لە ژیان؟لەڕاستیدا کەس وەکو ئەو قسەی ڕاست ودروست وچیرۆکی کاریگەر ناگێڕێتەوە،،کاتێك مردن یەخەمان پێدەگرێ ئەوکات دەزانین کە چەن کەمتەرخەم بوین لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پەروەردگار، باشە مردوو دەبێ ئاواتی چی بخوازێ ؟ دەفتەر دۆلارو کۆشك تەلارو پلەو پایە ؟؟یان سەردان کردنی برادەرەکانی سەرجادە ؟ یان ئەنجامدانی موکالەمەیەکی تەلیفۆنی ؟ یان ناردنی نامەیەکی خۆشەویستی ؟ یان کێشانی جگەرەیەك ؟ یان... هتد.

نا سوێند بەخودای گەورە یەکەمین شتێك لەو ساتە وەختە ئاواتی بۆ بخوازین یەکەمین شتە کە لە دونیا یان هیچ نرخێکمان بۆی دانەناوە و جێبەجێمان نەکردوە یان هەر لەکۆڵمان کردوەتە، ئەوەیش نوێژ کردنە. مردوو ئاوات ئەخوازێ بگەڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا بۆ ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژ هەروەکو أبو هريره فەرمویەتی: (أن رسول الله صلى الله عليه وسلم مر بقبرٍ فقال: من صاحب هذا القبر ؟ فقالوا: فلان، فقال: (ركعتان أحب إلى هذا من بقية دنياكم، وفي

رواية: ركعتان خفيفتان مما تحقرون وتنفلون، يزيدها هذا في عمله، أحب إليه من بقية دنياكم.) (صحيح الترغيب و الترهيب)ئای بۆ ئەو داخ وئێشەی کە ڕەگی دڵ لەبن دێنێ کاتێك بیر لەو فەرموودە زێڕینەی پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) دەکەمەوە کەدەفەرموێت: (نعمتان مغبون فيها كثير من الناس ؛ الصحه والفراغ) (رواه البخاري) واتە: دوو نیعمەت هەیە کە زۆربەی خەڵکی پشتگوێیان خستووە وتێیدا زەرەرمەندن ئەوانیش: لەش ساغی وکاتی بەتاڵە.هەرچەندە مرۆڤ لەم دونیایە بژی و هەرچەندە تەمەنی درێژ بێت و لەزۆنگاوی ئارەزووەکانیدا تێر تێر بنۆشێ و بەدرێژایی ڕۆژگار شوێنکەوتووی خۆزگەکانی بێت، چارەنووسی یەك چارەنووسەو نەگۆڕە ئەویش ((مردنە)).بێ گومان ئەم چارەنووسە چارەنووسی هەموو مرۆڤێکە کەدەرچوون و خۆحەشاردان لێی ئەستەمە وەکو خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ( كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ) (سورة العنكبوت:٥٧)،، واتە: هەموو کەس دەبێت مردن بچێژێت (کەی، لەکوێ، بەچی خودانەبێت کەس نازانێت) لەوەودوا تەنها بۆ لای دەگەڕێنەوە.

وە هەروەکو شاعیریش دەڵێت:: کل ابن أنثى وإن طالت لاسلامته *** یوما على آلة الحدباء محمول

واتە: مرۆڤ هەرچەندە ساغ و سەلامەتیش بێت *** ڕۆژێك دێت لەنێو تابوتدا بەسەرشان بیبەن بۆ گۆڕستان.

ڕۆژێکە کەهەموو دروست کراوەکانی خودا دەگەڕێنەوە بەردەستی ئەو بۆ ئەوەی ووردو درشتی کردەوەکانیان لێ بپرسێت لەم دونیایە کەئەنجامیان داوە. [ وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ] (سورة البقرة:٢٨١)،

واتە: (خەڵکینە) لە سزاو تۆڵەی ڕۆژێك بترسن کە تیایدا بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە.

* بەڵێ بەڕێزان مردن چارەنووسێکە هەرچەندە ئێمە ئەومان لەیاد کردووە بەڵام ئەو ئێمە لەیاد ناکات، ئەو ڕۆژە دوایەمین ڕۆژەکانی ژیانە، ئەو ساتەیە کەقوڕگت ووشك دەبێت. پەنا ئەگرین بەخودای گەورە ..خودای گەورە کۆتایمان چاک و خێر بکات

دووی ڕەبیعی یەکەمی 1438 کۆچی
بەرامبەر بە 2016/12/2 زاینی

# کۆتایی

لێرەدا هاتمە کۆتای بڕگەکان،هیوادارم لەدوعای خیر بێ بەشــمان نەکەن ،خودای گەورە لە گوناهو هەڵە کرچوکاڵی هەموولایەکمان ببورێت.ئەگەر هەڵەوکەموکوڕی لەنووســیانەکانم دا بێت ئەوە تەنها لە مێشـك کورتی نەزانی خۆمەوەیە ، ئەوەشی کە ڕاسـتیم پێکابێ لە فـەزڵ و پـاداشــتی خـودای پـەروەردگـارە وەیـە ..خـودای گـەورە بەردەوامیمان پێ ببەخشـێت و کۆتایمان خیروچاك بکات ، خودای گەورە دڵەکانمان بە خۆشــەویســتی ویادی خۆی پەیوەســت بکات وهەموو هەڵســوکەوت وکاروچالاکیەکمان بۆ ڕزامەندی خۆی بێت ، هەموو هەڵســوکەوت وکاروچالاکیەکانمان بە گوێرەی شــەرع بێت وهەموو کرداروگوفتارێکمان بە پێودانگی شــەرع بپێوێت ولە میزانی شەرعی بدات.قسەو کردەوەشمان یەك بێت

**وأسأل الله الكريم ربَّ العرش العظيم بِأسمائهِ الحسنى وصفاتهِ العليا أن يصلح لنا شأننا كله، وأن لايكلنا إلى أنفسنا طرفة عين، اللهم آتِ نفوسنا تقواها، وزكها وأنت خير من زكاها، أنت وليها ومولاها.**

**وَآخِرُ دَعْوَانا أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**

**وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم .**

براتان؛ئەرسەلان شەوکەت عبدالرحمان
ناسراو بە عەلی هەولێری فێرگە

alihawleriferga47@yahoo.com

11 ڕەبیعی یەکەمی 1438 کۆچی

بەرامبەر بە 1212016/11 زاینی ، ئەسینا /یۆنان

# پـــێـــرســـت